# زكاة الفطر

## زەکاتی سەرفترە



ئامادەکردنی :

عبدالقهاری ملا محمود




ڕەمەزانی - 1443 - هیجری

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک:  زەکاتی سەرفترە

ئامادەکردنی: عبدالقهاری مەلا محمود

نەخشەسازیی ناوەوە: عبداللّٰه خاکی

نەخشەسازیی بەرگ: محمد سیانی

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٣ کۆچی – ٢٠٢٢ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە « »ی

ساڵی  «٢٠٢٢»ی پێ دراوە



# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين وصلى الله على نبينا محمد ﷺ وعلى آل وأصحابه أمابعد.

دیارە ساڵانە لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا بابەتی زەکاتی سەرفترە ئەبێتەوە سەرباس وە بەجۆرێک لە جۆرەکان ڕاجیایی و بۆچوونەکان زەق ئەکرێنەوە و هەر یەکەش سەرکەشانە بەرگری لە تێگەیشتنەکەی ئەکات وە لەکۆتاییدا بەشێک لەگومان لە دڵی موسوڵمانان جێ ئەهێڵرێت کە ئایا زەکاتی سەرفترەکەی قبوڵ بووە یان نا!

بۆیە لێرەدا هەوڵ ئەدەین بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و تێگەیشتنی زانایان لەڕووی شەریعەتەوە باس لە زەکاتی سەرفترەو ئەحکام و بابەتەکانی پەیوەست بەم بابەتە بکەین.

الله عزوجل پشتیوان و یارمەتیدەرمان بێت لە ڕوونکردنەوەکەمان وە نیەتمان خالص بکات و تەنها ئامانجمان ڕەزامەندی ذاتی بەرزی الله بێت.



# زەکاتی سەرفتر

زەکات و صەدەقەیەکە کە لە کۆتایی ڕەمەزاندا دەرئەکرێت لە شەوی تەواوبوونی ڕەمەزان تاکو پێش نوێژی جەژن.

زەکاتی فطر بۆیە بەو ناوە ناونراوە چونکە هۆکارەکەی افطار (فتارکردنەوە) ڕەمەزانە (واتە کۆتا ڕۆژوو شکاندنە).

لە کۆتایی ڕەمەزانی ساڵی دووی هیجری دانراوە، وە زەکاتی ڕەمەزانیشی پێ ئەوترێ، چونکە تەنها پەیوەستە بە مانگی پیرۆزی ڕەمەزانەوە.

ڕاجیایی تریش تەنانەت لەبارەی مانای ناوەکەشی هەیە.



بەڵام لە کۆتاییدا ئامانجەکە و مەبەستەکەی دیارە کە بۆ خۆراک پێدانی موسوڵمانانی هەژارو پاکبوونەوەی ڕۆژووی موسوڵمانانە لەو قسەو کردارە خراپانەی کە لە کاتی ڕۆژووەکەدا بە هەڵە وتوویەتی یان ئەنجامی داوە.

(عبدُالله بن عباس رضي الله عنهما ئەفەرمووێت:
"فرَض رسولُ الله ﷺ زكاةَ الفطر؛ طُهرةً للصَّائم مِن اللَّغو والرَّفث، وطُعمةً للمساكين، مَن أدَّاها قبلَ الصلاة فهي زكاة مَقبولة، ومن أدَّاها بعد الصلاة فهي صدقة من الصدقات)[1]

واتە: ابن عباس (رضيِ الله عنه وارضاه) ئەفەرموێت:
پێغەمبەر ﷺ زەکاتی سەرفترەی بەفەرز ڕاگەیاند وەکو پاککەرەوەیەک بۆ ڕۆژووەوانان لەقسەی ناپێویست و لەغو لەکاتی ڕۆژووەکەیاندا وە کردی بەخۆراکی هەژارەکان جاهەرکەس پێش نوێژی جەژن بیدات ئەوا زەکاتێکی قبوڵکراوە ئەوەشی دوای جەژن بیدات ئەوە خێرێکی ئاساییە و زەکاتی سەرفترە نیە.

---

[1] - رواه أبو داود (١٦٠٩) وابن ماجه (١٤٩٢)، والدارقطني (١٣٨/٢)، والحاكم (٥٦٨/١)



واتە پاککەرەوەی ڕۆژووە لەشتە ڕێ پێ نەدراوەکان کە ئەکرێ بەهەڵە بەسەرمانا تێپەڕ ببێت بەم زەکاتە پاک ئەبێتەوەو بەپاکی ئەگات بە الله سبحانە و تعالى.

النووي لە المجموع لە وكيع بن الجراح (رحمه الله) ئەگێڕێتەوە کە مامۆستای ئیمام شافعی یە (رحمهم الله)

وکیع ئەڵێت: (زكاةُ الفطْرِ لشَهْرِ رَمَضانَ كَسَجْدَتيَ السَّهْوِ للصَّلاةِ؛ تَجْبُرُ نُقْصانَ الصَّوْمِ كَما يَجْبُرُ السُّجُودُ نُقْصانَ الصَّلاةِ)[1]

واتە: زەکاتی سەرفترە بۆ مانگی ڕەمەزان وەکو دوو سوجدەکەی سەهووە لەنوێژدا ئەمیان کەموکورتی ڕۆژوو چاک ئەکات و سوجدەی سەهووش هەڵەو کەموکورتی نوێژەکە ئەپۆشێت.

[1] - المجموع ٦/١٤٠.

جا زەكاتی سەرفترە پاككەرەوەی نەفسە لە ڕەزیلی وە تەواوكەری پاداشتی ڕۆژووی ڕەمەزانە و هاوكاری تاكە موسوڵمانەكانە بۆ یەكتر وە پاككەرەوەی ڕۆژووە وەک لە ووتەكەی ابن عباسدا (رضي الله عنه) ئامانجەكەی ڕوونكردووەتەوە.

وە خاڵێكی گرنگ ئەوەیە كە هاوكارو یارمەتیدەرە بۆ هەژارەكان كە پێویستی ڕۆژی جەژنیان پڕ ئەكاتەوەو دڵیان خۆش ئەكات لەڕۆژی دڵخۆشی تەواوی موسوڵمانانداكە ئەمەش تەواوكەری سیفەتەكانی مانگی ڕەمەزانە كە هەستكردنە بەحاڵی هەژاران و وە ئەم عیبادەتە خاڵی كۆتایی دائەنێت بۆ ڕستەی جوانیەكانی مانگی ڕەمەزان كە تیایدا هەستی بەحاڵی تینوێتی و برسیەتی هەژاران كرد و لەجەژندا یارمەتیان ئەدات.



## حوكمی شەرعی سەرفترە:

حوكمی شەرعی سەرفترە لەسەر موسوڵمان واجبە لای زانایانی (شافعیەكان و حەنبەلیەكان و مالیكیەكان و حەنەفیەكان وظاهریەكان) وە تەنانەت اجماعی لەسەرنەقڵكراوە بەبەڵگەی ئەوەی كە عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) ئەفەرموویێت:

(فرَض رسولُ الله ﷺ زكاةَ الفطرِ صاعًا من تمَر، أو صاعًا مِن شَعيرٍ، على العبدِ والحرِّ، والذَّكرِ والأنثى، والصَّغيرِ والكَبيرِ مِنَ المسلمين)[١]

واتە: رسول الله ﷺ زەكاتی سەرفترەی فەرزكرد لەسەر موسوڵمانان صاعێك خورما یان جۆ ، لەسەر كۆیلەو انسانی ئازاد وە نێر و مێ وە گەورەو بچوكی موسوڵمانان.

(دواتر لەشوێنی خۆیدا باسی بڕی پێوەری صاع ئەكەین)

[١] - رواه البخاري (١٥٠٣)، ومسلم (٩٨٤، ٩٨٦).



## ئەم جۆرە زەکاتە لەسەر کێ پێویستە؟

واجبە لەسەر هەموو تاکێکی موسوڵمان بچوک بێت یان گەورە نێر بێت یان مێ ئازاد بێت یان عەبد بێت.
بەبەڵگەی سوننەت و إجماع

لە سوننەتدا:
(عن ابن عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عنهما: (أنَّ رسولَ الله ﷺ فَرَضَ زكاةَ الفطرِ صاعًا مِن تمرٍ، أو صاعًا مِن شَعيرٍ، على كلِّ حرٍّ أَو عبْدٍ، ذكَرٍ أو أنثى من المُسلمينَ)[١].

وە لە اجماعدا: ابن رشد و ابن قدامە اجماعیان نقڵ کردووە

[١] - رواه البخاري (١٥٠٤)، ومسلم (٩٨٤)





ابنُ رشد (أجْمعوا على أنَّ المُسلمينَ مُخاطَبون بها، ذُكرانًا كانوا أو إناثًا، صِغارًا أو كِبارًا، عبيدًا أو أحرارًا؛ لحديث ابن عُمَرَ المتقدِّم، إلَّا ما شذَّ فيه اللَّيثُ، فقال: ليس على أهل العَمود زكاةُ الفِطر، وإنَّما هي على أهل القرى، ولا حُجَّةَ له، وما شذَّ أيضًا من قَولِ مَن لم يوجِبْها على اليَتيم)[1].

واتە: اجماع لەسەر ئەوەیە کە تەواوی موسوڵمانان داوایان لێ کراوە (لەسەریان فەرزکراوە) (زەکاتی سەرفترە بدەن) جا نێربن یان مێ بچوک بن یان گەورە عەبد بن ئازاد بەبەڵگەی حەدیثەکەی ابن عمر...هتد.

(اتَّفقوا على أنَّها تَجبُ على المرءِ في نفْسه، وأنَّها زكاةُ بَدَن لا زكاةُ مال، وأنَّها تَجِبُ في وَلَده الصِّغار عليه إذا لم يكُنْ لهم مالٌ، وكذلك في عَبيدِه إذا لم يكن لهم مالٌ)[2]

واتە: ڕێککەوتوون (کۆدەنگن) لەسەرئەوەی کە واجبە لەسەر انسان بۆ نەفسی خۆی وە ئەوە زەکاتی جەستەیە نەک سەروەت و ماڵ، وە لەسەری پێویستە هی مناڵە بچووکەکانیشی بدات کە سەروەت و داراییان نیە ، هەروەها لەبری کۆیلەکانی ئەگەر خۆیان نەیان بوو.

[1] -(بداية المجتهد) (٢٧٩/١).

[2] - (بداية المجتهد)) (٢٧٩/١).



ابنُ قُدامة (زكاةُ الفِطرِ تَجِبُ على كلِّ مسلم، مع الصَّغيرِ والكبيرِ، والذُّكوريُّة والأنوثيَّة، في قولِ أهل العلمِ عامَّةً، وتجبُ على اليَتيم، ويُخرِجُ عنه وليُّه مِن مالِه، لا نعلَمُ أحدًا خالف في هذا، إلَّا محمَّدَ بنَ الحَسَنِ؛ قال: ليس في مالِ الصَّغيرِ من المُسلمينَ صَدَقةٌ)[1]

واتە: زەکاتی سەرفترە واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێک بچوک و گەورە نێر و مێ لەقەولی زانایان بەگشتی (واتە کۆدەنگی) وە لەسەر هەتیویش پێویستە و کەسەکانی بۆی ئەدەن وە کەسێک نازانین ڕاجیایی لەسەر ئەمە هەبێت جگە لە محمد بن حسن الشيباني ئەڵێ: لەماڵ و سەروەتی موسوڵمانانی تەمەن بچوک زەکاتی تیانیە!

کەواتە زەکاتی سەرفترە لەسەر هەموو موسوڵمانێک واجبە جگە لەو کەسەی کە لەقوتی ڕۆژی جەژنی زیاد نەبێت.
ئەو کات بە اجماع ئەڵێن زەکاتی لەسەر نیە.

[1] - (المغني) (٣/٧٩).



ابنُ المُنْذِرِ: (أجمع كلُّ مَن نحفظ عنه على أنَّ من لا شيء له فلا فطرة عليه)[1].

واتە: اجماعی هەموو ئەوانەی کە لێیانەوە زانستمان بیستووە واتە اهلی عیلمن لەسەر ئەوەن کە ئەوەی هیچی نیە زەکاتی سەرفترەشی لەسەرنییە.

وە جمهوری زانایانی شافعیەکان و حەنبەلیەکان و مالیکیەکان لەسەر ئەوەن کە لەسەر کەسێک واجبە کەلە قوتی خۆی و ئەوانەی بەخێو کردنیان لەسەر ئەوە زیادەی هەبێت.

[1] - الإشراف(٣/٧٤)، المجموع(٦/١١٣).



بەڵگەکان:

١. لەقورئاندا:

لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا [البقرة: ٢٨٦]

٢. لەسوننەتدا:

أ. حەدیثەکەی ابن عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عنهما: (أنَّ رسولَ الله ﷺ فَرَضَ زكاةَ الفِطرِ صاعًا مِن تَمر، أو صاعًا من شَعيرٍ على كلِّ حرٍّ أو عبدٍ، ذكرٍ أو أنثى مِنَ المُسلمين)[١]

بەڵام لێرەدا دیاری نەکراوە واتە گشتگیرە و هەمووکەس ئەگرێتەوە بەڵام بە فەرموودەی تر تایبەت (تخصيص) کراوە.

[١] - رواه البخاري (١٥٠٤)، ومسلم (٩٨٤).



ب. حەدیثەکەی ابن عبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عنهما، قال: (فرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زكاةَ الفِطرِ طُهرةً للصَّائِمِ مِنَ اللَّغوِ والرَّفَثِ.)[1]

لەم بەڵگەیەدا ئەڵێت بۆ پاکبوونەوەی ڕۆژووەوانە لەوەشدا جیاوازی نیە لە نێوان دەوڵەمەند و هەژار.

زەکاتی لەسەر خودی کۆیلە واجب نیە کە خۆی بیدات بەڵکو گەورەکەی لەجیاتی ئەو ئەیدات ئەوەش بە کۆدەنگی هەر چوار مەزهەبەکە.

[1] - أبو داود (١٦٠٩)، وابن ماجه (١٨٢٧)، والدارقطني (١٣٨/٢)





## کاتی بەخشینی زەکاتی سەرفترە:

فطر یاخود افطاری کۆتا ڕۆژ، کاتی زەکاتی سەرفترەیەو هۆکاری ناو نانەکەشی ئەوەیە کە کۆتا افطارکردنەوەیە ئیتر ڕۆژووی فەرزی لەدوانیە لەو ساڵەدا.

بۆیە کاتی واجب بوونی زەکاتی سەرفترە لە ئێوارەی کۆتاڕۆژی ڕەمەزانە تاکو پێش نوێژی جەژن، بەبەڵگەی حەدیثی ابن عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عنهما :

(أمَر رسولُ الله ﷺ بزكاةِ الفِطرِ أنْ تُؤدَّى قبل خُروجِ النَّاسِ إلى الصَّلاةِ)[1]

واتە: رسول الله ﷺ فەرمانی کرد کە زەکاتی سەرفترە لەپێش نوێژی جەژن بدرێت.

[1] - رواه البخاري (١٥٠٣)، ومسلم (٩٨٦)



باشترین کاتیش بەپێی سوننەت پێش دەرچوونە بۆ نوێژی جەژن بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و اجماع.

لە قورئاندا:

(قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى وَ ذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى)[1]

لە سوننەتدا:

حەدیثەکەیابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عنهما:

(أَمَر رسولُ اللهِ ﷺ بزكاةِ الفِطرِ أن تُؤدَّى قبل خُروجِ النَّاسِ إلى الصَّلاةِ)[2]

[1] - [الأعلى: ١٤-١٥]

[2] - رواه البخاري (١٥٠٣)، ومسلم (٩٨٦)





لە اجماع:

العبدري ، وابنُ الحاجب كۆدەنگی نەقڵ ئەكەن.

قال العبدري: ( أجمَعوا على أنَّ الأفضَلَ أنْ يُخرِجَها يومَ الفِطرِ قبلَ صلاةِ العيدِ)[1].

واتە: زانایان كۆدەنگن لەسەرئەوەی كە باشتر ئەوەیە لەڕۆژی جەژندا پێش نوێژیجەژن دەربكرێت.

قال العدوي: (قيَّده ابن الحاجب بقَبل الغُدوِّ إلى المصلَّى، وحكى عليه الاتفاق)[2].

واتە: ابن الحاجب ئەیبەستێتەوە بە پێش ڕۆیشتن بۆ نوێژگەی جەژن (مصلى) تەنانەت باسی هاوڕایی ئەكات لەنێوان تەواوی زانایان لەسەر ئەوە.

---

[1] - (المجموع للنووي (١٤٢/٦)

[2] - (حاشية العدوي على كفاية الطالب الرباني) (٥١٤/١).





## زەکاتی سەرفترە بە چ شتێک بدرێت و بڕەکەی چەندە؟

زەكاتی سەرفترە لە قوتی خەڵكی شوێنەكە (واتە ئەو خواردنانەی هەڵئەگیرێت و بە زەخیرە دائەنرێت) دەرئەكرێت.
وە نەبەستراوەتەوە تەنها بەو سێ جۆرەی كە لە فەرموودەكەدا هاتبوو كە بریتی بوون لە (جۆو گەنم و مێوژ) چونكە ئەوە لەو كاتەدا خۆراكی سەرەكی خەڵكی مەدینەبوو كە ئێستا تەنانەت بۆ خەڵكی مەدینەش هەمان ئەو خۆراكانە خواردنی سەرەكی خەڵك نیە.

بۆیە هەر شتێك قوت بێت ئاساییە وەكو (گەنم ، جۆ، برنج، ساوار، نیسك، نۆك، فاسۆلیا.....هتد)

وە ئەبێ جۆرەكەی (أوسط) بێت واتە لەو جۆرەی كە لەماڵی خۆتدا ئەیخۆیت.



وە بڕی زەكاتی سەرفترە بۆ هەر كەسێک بریتیە لە (صاع)ێک کە چوار مشتە.

بەو پێوەرەش بە کیلۆگرام لەنێوان ٢,٥٠٠ کگم تاکو ٢,٨٥٠ کگم ئەبێت ئەویش بەپێی جۆری قوتەکە و کێشی هەرمشتێکی ئەبێت والله اعلم.

زەكاتی سەرفترە ئەدرێت بە کێ؟

پێشتریش لەسەرەتادا ئاماژەی پێکرا کە عبدُالله بن عباس رضي الله عنهما ئەفەرموویێت:

(فرَض رسولُ الله ﷺ زكاةَ الفطر؛ طُهرةً للصَّائم مِن اللَّغو والرَّفث، وطُعمةً للمساكين، مَن أدَّاها قبلَ الصلاة فهي زكاة مَقبولة، ومن أدَّاها بعد الصلاة فهي صدقة من الصدقات)[١]

---

[١] - رواه أبو داود (١٦٠٩) وابن ماجه (١٤٩٢)، والدارقطني (١٣٨/٢)، والحاكم (٥٦٨/١)





واتە ابن عباس رضي الله عنهما ئەفەرمووێت:
پێغەمبەری ئازیز ﷺ زەکاتی سەرفترەی بەفەرز ڕاگەیاند وەکو پاککەرەوەیەک بۆ ڕۆژووەوانان لەقسەی ناپێویست و لەغو لەکاتی ڕۆژووەکەیاندا وە کردی بەخۆراکی هەژارەکان جاهەرکەس پێش نوێژی جەژن بیدات ئەوا زەکاتێکی قبوڵکراوە ئەوەشی دوای جەژن بیدات ئەوە خێرێکی ئاساییە و زەکاتی سەرفترە نیە.

بەو پێیەی کە ئەفەرمووێت (کردی بەخۆراکی هەژاران)
واتە ئەدرێت بە بەشێک لە صنفەکانی زەکات کە بریتین لە (الفقراء، المساکین) نەک هەموو بەشەکان ئەگەرچی لەنێو زانایاندا ئەو بۆچوون و تێگەیشتنەش هەیە کە ئەدرێت بەهەموو صنفەکانی زەکات.!



تێبینی:

١. مەرجە ئەو کەسەی زەکاتی سەرفترە ئەدات و ئەوەشی وەری ئەگرێت موسوڵمان بن واتەهیچ جۆرە شیرک و کوفرێکیان نەبێت.

٢. ئەمە کتێبێکی زانستی نیە بەڵکو زانیاریە بۆیە شێوازی نووسینەکەشی بە جۆرێک داڕێژراوە کە کەسانی ئاسایی کە زانستخواز (طالب علم)یش نەبن زۆربەئاسانی لێی تێ بگەن و حەقیقەتی بابەتەکەیان بۆ ڕوون بێتەوە.

٣. ئەگەرچی زۆرجار باسی ئەوە دەکرێت کە بەپارە زەکاتی سەرفترە دەربکرێت بەڵام ناشێت بەپارە زەکاتی سەرفترە دەربکرێت چونکە ئەگەرچی لەڕووی لێکدانەوەی عەقڵی مرۆڤەوە پارە فرەبەکارهێنان بێت و لەبواری زیاتردا سوودی لێ ببینرێت بەڵام رسول الله ﷺ فەرمووی: (طعمةً للمساكين)



کەواتە بەپێی ئەم فەرموودەیە ئەگەرچی کەسی وەرگر سوود لەپارە ئەبینێت بەڵام کەسی زەکاتدەر زەکاتی سەرفترەکەی لەسەر لاناچێت و تەنها صەدەقەیەکە بۆی والله تعالی اعلم.

٤. زانایان ئەڵێن ئەگەر زەرورەت حوکمی کرد بەپێش خستنی سەرفترە بۆ ماوەی ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ بۆ نموونە بەناردنی بۆ شارێکی تر یان شوێنێکی تر لەبەر زەروری ئەوا ئەکرێ و ڕێ پێدراوە والله اعلم.

٥. ئەگەر لەکاتی خۆیدا لەبیرکرا بەپێی ووتەی جمهور شافعیەکان و حەنبەلیەکان و مالکیەکان و ظاهریەکان، ئەڵێن: ئەبێت قضاءبکرێتەوە چونکە وەک نوێژنیە بەتێپەڕبوونی کاتەکەی نەکرێتەوە هۆکاری ئەم عیبادەتە پاکبوونەوەی ڕۆژووەوانە بۆیە هۆکارەکەی هەر ماوەو ئەبێت قضاء بکرێتەوە والله اعلم.

براتان: عبدالقهاری مەلا مەحمود

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين

و صلى الله على سيدنا محمد و على آله و صحبه اجمعين.



# ناوەڕۆك


| ڕیزبەند | سەرە بابەت | ژمارەی لاپەڕ |
|---|---|---|
| ١ | پێشەکی نووسەر | ٤ |
| ٢ | زەکاتی سەرفترە | ٥ |
| ٣ | حوکمی شەرعی سەرفترە | ٩ |
| ٤ | ئەم جۆرە زەکاتە لەسەرکێ پێویستە؟ | ١٠ |
| ٥ | کاتی بەخشینی زەکاتی سەرفترە | ١٦ |
| ٦ | زەکاتی سەرفترە بەچ شتێك بدرێت و بڕەکەی چەندە؟ | ١٩ |
| ٧ | ناوەڕۆك | ٢٤ |